# ئیمامی بوخاری وسەحیحەکەی

نوسینی

**شێخ عەبدولموحسین بن حەمەد ئەلعەبباد ئەلبەدر**

وەرگێڕانی

**خدرنەژاد کوردستانی**

مافی بڵاوکردنەوەی بە شێوەی ئەلیکترۆنی بۆ هەموو موسوڵمانێکە

# پێشەكیی وەرگێڕ

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على عبده ورسوله وخليله إمام الأنبياء والمرسلين محمد الصادق الأمين، وعلى آله وأزواجه وأصحابه أجمعين، ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

تێكڕای ئەهلی سوننەت و جەماعەت، بە بێ ناكۆكی، بەڵكوو بە یەكڕەنگی و بە هاودەنگی، هەمیشە دەڵێن و دووپاتی دەكەنەوە كە: دروستترین و بێخەوشترین دووكتێب لە پاش كتێبەكەی خودای گەورە (قورئانی پیرۆز)؛ بریتین لە: سەحیحی بوخاری و سەحیحی موسلیم، زۆربەی زۆری ئۆمەتیش بوخاری لە پێشتر دادەنێن، جا خودایە وا ئێمەش

## ئیمامی بوخاری و سەحیحەکەی

وەک ئەندامانێک لە کۆمەڵی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەم شاهێدییە دەدەین و دووپات و چەندپاتیشی دەکەینەوە.

بەڵام! بۆ ئەوەی ئەم شاهێدییە دروستە لە سەر بناغەی زانست بێت، وە ئەگەر داوای ڕوونکردنەوە و بەڵگەمان لێکرا لەم بارەیەوە، بتوانین بیسەلمێنین و تەنها چاولێکەری نەبێت؛ پێویستە بزانین ئەم بوخاری و موسلیمە کێ بوون و چییان کردووە و کەی بوون و یار و نەیارانیان چییان گوتووە دەربارەیان، هەروەها بزانین کتێبەکانیان چۆنن و چی سیفەتێگەلێکی تایبەتییان هەیە کە کتێبەکانی دیکە نییانە و بزانین زانایان چییان لەبارەیانەوە فەرمووە و... هتد، بۆ ئەم زانین و ناسینەش، سەرچاوەی زۆر هەن  لە باسی بوخاری و موسلیم و بەسەرهاتی ژیانیان و هەردوو سەحیحەکەیاندا، لە دوتوێی کتێبە مێژووییەکاندا و هەروەها چەندین کتێبی سەربەخۆش کە باس لە ژیان و بەسەرهات و زانست و

## ئیمامی بوخاری و سەحیحەکەی

پێگەی ئەم دوو پێشەوایە و هەردوو پەڕتووکە بەپێزەکەیان دەکەن، لەو باسە سەربەخۆیانەش کە بە جوانی و بە ڕێکوپێکی و لە هەمان کاتدا بە پوختی لەم بارەیەوە نووسراون؛ بریتییە لە دوو باسەی کە زانای بەڕێز شێخ عەبدولموحسین بن حەمەد ئەلعەبباد ئەلبەدر،

یەکێکیان بە ناوی: (الإمام البخاري وكتابه الجامع الصحيح)، ئەوی دیکەش: (الإمام مسلم وصحيحه)،

هەربۆیە بەندەی هەژار زۆر بە شیاوم زانی هەوڵ بدەم وەریانگێڕمە سەر زمانی کوردی تا برایان و خوشکانی موسوڵمانی ئازیزی کوردیش؛ ئاشنا ببن بەم دوو پێشەوا گەورەیە و هەردوو کتێبە بەپێزەکەیان، بۆ ئەوەی شاهێدییەکەشمان لە زانین و ناسینەوە بێت.

## ئیمامی بوخاری و سەحیحەکەی

هەربۆیە بە کۆمەکی خودای گەورە دەستم دایە وەرگێڕانی یەکەمیان بە ناوی (ئیمامی بوخاری و سەحیحەکەی)، وە هەرجارەو بەشێکیم
بڵاودەکردەوە، کە هەشت بەش بوو، سوپاس بۆ خودای گەورە وا ئێستاش بە شێوەی پەڕتووکی ئەلیکترۆنی سەرجەمی پێکەوە دەخەینە بەردەست، سا خودای میهرەبان کۆمەکمان بکات بۆ بەئەنجامگەیاندنی دووەمیش بە ناوی (ئیمامی موسلیم و سەحیحەکەی) وە لە نووسەر و وەرگێڕ و بڵاوکار و خوێنەری ئەم نامەیە و لە دایک و باوکیشمان خۆش ببێت.

وصل اللهم وبارك على محمد وعلى آله وأصحابه والتابعين لهم بإحسان.

وەرگێڕ

خدرنەژاد کوردستانی

## ❁ ناو و نەژادی بوخاری

❁ موحەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی موغیرە کوڕی بەردیزبەی جوعفی.

❁ کونیەی "ئەبوعەبدوڵڵا" یە.

❁ بەردیزبەی باپیرە گەورەی فارسێکی ئاگرپەرست بووە.

❁ بەڵام موغیرەی باپیرەی لە سەر دەستی یەمانی بوخاری کە والیی بوخارا بووە؛ موسوڵمان بووە، یەمانیش جوعفی بووە، هەر بەو بۆنەیەوە ئەوانیش بە جوعفی ناو دەبرێن.

❁ سەبارەت بە ئیبراهیمی باپیری؛ حافیز ئیبن حەجەر دەفەرموێت: هیچ هەواڵێکیم لەبارەیەوە دەست نەکەوتووە.

❁ سەبارەت بە ئیسماعیلی باوکی؛ ئیبن حیببان لە کتێبی (الثقات) دا بەم چەشنە ناساندوویەتی: "ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم باوکی بوخاری، لە حەممادی کوڕی زەید و

مالیکەوە گێڕانەوەی هەبووە، لە ئەویشەوە عێراقییەکان"، هەروەها حافیزیش لە (تهذيب التهذيب) دا ناساندوویەتی.

## ❁ مێژوو و شوێنی لەدایکبوونی

❁ بوخاری (بەڕەحمەت بێت) لە شاری بوخارا لە دایک بووە، کە یەکێکە لە شارە هەرەگەورەکانی وڵاتانی ئەوبەری ڕووبار، لەگەڵ سەمەرقەنددا ماوەی هەشت ڕۆژیان نێوانە.

❁ ١٣ ی مانگی شەووالی ساڵی ١٩٤ی کۆچی، دوای نوێژی هەینی لەدایکبووە.

## ❁ پێگەیشتنی و وەدووکەوتنی زانست

❁ بوخاری (بە ڕەحمەت بێت) هێشتا منداڵ بوو؛ باوکی وەفاتی کرد، ئیدی لە باوەشی دایکیدا پێگەیشت و هەر بەو منداڵییەی دەستیکرد بە خواستنی زانست.

## ئیمامی بوخاری و سەحیحەکەی

❁ موحەممەدی کوڕی ئەبوحاتیم کە نووسەری بوخاری بووە؛ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوێم لە بوخاری بوو دەیگوت: "هێشتا لە خوێندن و نووسیندا بووم کە لەبەرکردنی فەرمووده (حديث) م کەوتە مێشکەوە، گوتم: ئەوکات تەمەنت چەند دەبوو؟ گوتی: "دە ساڵان یان کەمتریش"، تا ئەوەی کە گوتی: "کە تەمەنم بوو بە شازدە؛ کتێبەکانی ئیبنولموبارەک و وەکیعم لەبەرکرد"، گوتی: "پاشان لەگەڵ دایکم و براکەمدا چووم بۆ حەج، کە پێم نایە هەژدە ساڵەوە؛ کتێبی (قضايا الصحابة والتابعين) م دانا، پاشان کتێبی مێژووەکەم لە مەدینە لە پاڵ گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) دانا و لەشەوانی مانگەشەودا دەمنووسی"، هەروەها گوتی: "کەم ناوێک هەبوو لە مێژوودا و چیرۆکێکی لەلام نەبێت، بەڵام پێم خۆش نەبوو کتێبەکە زۆر درێژ بێتەوە".

## ۞ گەشتی بۆ وەرگرتنی زانست و بیستنی فەرمووده

❅ وەک لە پێشەوە وتمان؛ بوخاری هەر لە منداڵییەوە خەریک بوو بە زانست و بیستنی فەرموودە، جا لە خەڵکی لای خۆیان؛ لە کەسانی وەک: موحەممەدی کوڕی سەلامی بەیکەندی و موحەممەدی کوڕی یوسفی بەیکەندی و عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی موسنەدی وئیبولئەشعەس و لە غەیری ئەمانەش گوێبیستی فەرموودە بووە.

❅ پاشان ساڵی ٢١٠ک لەگەڵ دایکی و ئەحمەدی کاکیدا دەچێت بۆ حەج، دایکی و کاکی دەگەڕێنەوە و ئەو دەمێنێتەوە بۆ خوێندنی زانست.

❅ لە مەککەی پیرۆز لە حومەیدی و خەڵکی دیکەش فەرموودە وەردەگرێت.

❅ لە مەدینەی پێغەمبەریش (ﷺ) لە عەبدولعەزیزی ئوەیسی و موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵڵا و خەڵکی دیکەش.

❄ پاشان سەفەر دەکات بۆ بۆ لای زۆربەی فەرموودەزانانی وڵاتان، لە خوراسان و شام و میسر و شارەکانی عێراق.

❄ زۆر جاران چووە بۆ بەغداد و خەڵکی ئەوێ لێی کۆبوونەتەوە و دانیان ناوە بە گەورەیی و فەزڵیدا و گەوایی تاقەسوارییان بۆ داوە، لە هەردوو زانستی "ڕیوایەت و دیرایەت" دا.

❄ لە "بەڵخ" لە مەککیی کوڕی ئیبراهیم و غەیری ئەویشی وەرگرتووە.

❄ لە "مەرو" لە عەلیی کوڕی حەسەن و عەبدوڵڵای کوڕی عوسمان و خەڵکی دیکەش.

❄ لە " نیساپوور " لە یەحیای کوڕی یەحیا و خەڵکی دیکەشی وەرگرتووە.

❄ لە " ڕەی " لە ئیبراهیمی کوڕی موسا و کەسی دیکەش.

❅ لە بەغداد لە شورەیحی کوڕی نوعمان و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و لە خەڵکی دیکەش وەریگرتووە.

❅ لە بەسرە لە ئەبوعاسیمی نەبیل و موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای ئەنساری و خەڵکی دیکەش.

❅ لە کوفە لە تەڵقی کوڕی غەننام و خەللادی کوڕی یەحیا و غەیری ئەمانیش.

❅ لە میسر لە سەعیدی کوڕی کەسیری کوڕی عەفیر و خەڵکی دیکەش.

❅ جگە لەمانەش لە خەڵکانێکی زۆری بیستووە، دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: لە هەزار و هەشتا کەسەوە تۆمارم کردووە، هەر هەمووشیان ئەهلی حەدیسن"، هەروەها گوتوویەتی: "هی هیچ کەسێکم تۆمارنەکردووە کە نەیگوتبێت: ئیمان گوتار و کردارە".

## ❁ زیرەکی و بەهێزیی لەبەرکردنی

❁ بوخاری (بە ڕەحمەت بێت) بیری زۆر بەهێز و لەبەرکردنییش گەلێک خێرا بوو، ئەوانەی کە ئاگایان لێی هەبووە شتی وای لێوە دەگێڕنەوە؛ کە سەرەڕای خەڵکی ئاسایی تەنانەت زیرەکەکان و هۆگرانی لەبەرکردن و شارەزایانیش سەریان لێ سووڕدەمێنی.

❁ ئەبوبەکری کیلزەوانی دەڵێت: "هی وەک موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلم نەدیوە، کتێبی زانستی وای دەبرد تەنها یەجار سەیری دەکرد، کەچی تێکڕای فەرموودەکانی لەبەر دەکرد، ئەمە تەنها بە یەک جار".

❁ موحەممەدی کوڕی ئەبو حاتیم کە نووسەری بوخاری بووە دەڵێت: "بە ئەبوعەبدوڵڵا موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلم گوت: هەرچییەکت لە دانراوەکەدا داناوە؛ هەموویت لەبەرە؟ لە وەڵامدا گوتی: "هەرهەموویم لەبەرە".

## ئیمامی بوخاری و سەحیحەکەی

❁ موحەممەدی کوڕی حەمدەوییە دەڵێت: لە بوخاریم بیست دەیگوت: "سەد هەزار فەرموودەی سەحیح و دووسەد هەزاری ناسەحیحم لەبەرە".

❁ موحەممەدی کوڕی ئەزهەری سەجستانی دەڵێت: لە کۆڕی سولەیمانی کوڕی حەربدا بووم، بوخاریش لەگەڵماندا بوو، ئەو تەنها گوێی دەگرت و نەیدەنووسی، یەکێک لە ئامادەبووانی کۆڕەکە بە ئەوەی تەنیشتی گوت: ئەوە بوخاری بۆ نانووسێت؟ پێی گوت: ئەو دەگەڕێتەوە بۆ بوخارا و لەبەر دەینووسێتەوە".

❁ یەکێک لە سەیرترینی ئەو شتانەی کە لە بارەیەوە گێڕدراوەتەوە؛ ئەوەیە کە حافیز ئەبو ئەحمەدی ئیبن عەدی دەیگێڕێتەوە، هەروەک لە (تأريخ بغداد) و (وفيات الأعيان) دا هاتووە، دەڵێت: لە ژمارەیەک شێخم بیست، دەیانگوت: کە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری دەچێ بۆ بەغداد و فەرموودەزانەکانی بەغداد بەم چوونەی دەزانن؛ لێی

کۆدەبنەوە و دەیانەوێت ڕادەی لەبەرکردنەکەی تاقی بکەنەوە، جا بۆ ئەم کارە پێشوەخت هەڵدەستن دەق و سەنەدی سەد فەرموودە هەڵدەگێڕنەوە، دەقی هەر فەرموودەیەک دەخەنە پاڵ سەنەدی فەرموودەیەکی دیکە و سەنەدی هەر فەرموودەیەکیش دەخەنەسەر دەقێکی دیکە، ئەوجا دە کەس دەهێنن و هەرکەسە و دە دانە لەو فەرموودە هەڵگێڕاوانەیان دەدەنێ، ئەوجا کاتێکیش بۆ کۆڕێک لەگەڵ ئیمامی بوخاری ڕێک دەخەن و بە دە کەسەکە دەڵێن: کاتێک کە هاتنە کۆڕەکەوە هەر کەسە و دە فەرموودە هەڵگەڕاوەکەی خۆی بە بوخاری بڵێت، ئیدی کۆڕ دادەنرێت و کۆمەڵێک لە فەرموودەزانانی غەریب لە خەڵکی خوراسان و شوێنانی دیکە و هی بەغدادیش ئامادەی کۆڕەکە دەبن، هەر کە کۆڕەکە دادەمەزرێت و ئامادەکاری تەواو دەبێت؛ یەکێک لە دە کەسەکە هەڵدەسێت و پرسیاری یەکێک لە دە فەرموودەکەی خۆی ئاراستەی بوخاری دەکات، بوخاری لە

وەڵامدا دەڵێت: "ئەم فەرموودەیە ناناسم"، یەکێکی دیکەشی ئاراستە دەکات، دیسان دەڵێت: "نایناسم"، بەردەوام هەر دە فەرموودەکەی کە لە هەمبانەیدایە ئاراستەی دەکات، بوخارییش هەر دەڵێت: "نایناسم"، تێگەیشتووەکانی کۆڕەکە هەندێکیان سەیری هەندێکی دیکەیان دەکەن و دەڵێن: ئەم کابرایە دەزانێت، بەڵام خەڵکەکەی دیکە بوخاری بە نەتوان و کەمتەرخەم و کاڵفام هەژمار دەکەن، پاشان یەکێکی دیکە لە دە کەسەکە هەڵدەسێت و فەرموودەکانی ئاراستەی بوخاری دەکات و بوخاریش هەر هەمان وەڵامی یەکەمی دەداتەوە، هەر بەم چەشنە تا هەر دە کەسەکە لە ئاراستە کردنی فەرموودەکانیان دەبنەوە، ئەوجا ئیمامی بوخاری کە دەزانێت هیچ لە هەمبانەیاندا نەماوە و لێبوونەتەوە؛ ڕوودەکاتە یەکەمیان و دەڵێت: فەرموودەی یەکەمت کە ئاوەهات گوت؛ ئەوە ڕاستەکەی ئاوەها و ئاوەهایە، فەرموودەی دووەمیشت؛ ئاوەها نییە و ئاوەهایە، سێیەم و چوارەم و تا هەر دە

فەرموودەکەی بە ڕیز بۆ ڕاست دەکاتەوە، بەم شێوەیە هەموو فەرموودەکانی هەر دە کەسەکە ڕاست دەکاتەوە، هەر دەقێک و دەیگێڕێتەوە پاڵ سەنەدی خۆی و هەر سەنەدە و بۆ لای دەقەکەی خۆی، ئەو کاتە ئیتر خەڵکی دان دەنێن بە بەهێزیی لەبەرکردنی و مل دەدەن بۆ گەورەیی ئیمامی بوخاری، حافیز ئیبن حەجەر لە کاتی باسکردنی ئەم بەسەرهاتەدا دەڵێت: " لێرەدا کە خەڵکی ملدەدەن بۆ بوخاری؛ سەیرەکە لەوەدا نییە کە بوخاری هەڵەکان ڕاست دەکاتەوە، چونکە ئەو حافیز بووە، بەڵکوو سەیرەکە لە یەکجار بەهێزیی بیری بوخاریدایە، کە چۆن هەڵەکانی ئەوانیشی هەر لە یەکەمەوە تا دوایین؛ هەمووی بەڕیز لەبەرکردووە" .

## ستایش وپێداهەڵگوتنی زانایان

❁ بوخاری (بە ڕەحمەت بێت) زۆر جێگای ڕێز بووە لە لای شێخەکانی و هاوتاکانی خۆیشی و غەیری ئەوانیش، لە خەڵکی هاوچەرخی و ئەوانەشی کە لە سەردەمانێکی پاش ئەو هاتوون، گەلێک ستایشیان کردووە و لە پێگەی بەرز و شایستەی خۆیدا دایاننناوە.

❁ هەردوو حافیزی گەورە زەهەبی و ئیبن حەجەری عەسقەلانی یەکی کتێبێکی تایبەتیان دربارەی لێهاتوویی بوخاری داناوە، بەو پێیەی کە زەهەبی لە (تذكرة الحفاظ) و ئیبن حەجەر لە (تهذيب التهذيب) دا باسیانکردووە.

❁ ئیمامی ئەبوعیسای تیرمیزی دەگێڕێتەوە کە: "موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل لای عەبدوڵڵای کوڕی مونیر بوو، کاتێک هەڵسا و ڕۆیشت؛ عەبدوڵڵا پێی گوت: ئەی ئەبوعەبدوڵڵا خودا بتکات بە کەڵەپیاوی ئەم ئۆمەتە، تیرمیزی دەڵێت: خودا ئەو دوعایەی بۆ گیراکرد".

❅ ئیمامی بوخاری خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "هەرکاتێک بچوومایە بۆ لای سولەیمانی کوڕی حەرب پێی دەگوتم: ئادەی هەڵەی "شوعبە" مان بۆ ڕوون بکەرەوە".

❅ موحەممەدی کوڕی ئەبوحاتیمی نووسەری بوخاری دەڵێت: گوێم لێبوو یەحیای کوڕی جەعفەری بەیکەندی دەیگوت: ئەگەر بمتوانیبا لە تەمەنی خۆمم بخستایە سەر تەمەنی بوخاری ئەو کارەم دەکرد، چونکە مەرگی من مەرگی تەنها کەسێکە، بەڵام مەرگی بوخاری دەبێتە مایەی نەمانی زانست".

❅ ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێت: "خۆراسان هی وەک بوخاریی لێ دەرنەکەوتووە".

❅ ئیمامی بوخاری خۆی فەرموویەتی: "لە ئاست هیچ کەسێکدا خۆمم بەبچووک نەهاتۆتە پێش چاو لای عەلیی ئینبولمەدینی نەبێت"، کە ئیمامی عەلیی ئیبنولمەدینی ئەم قسەیەی بوخاریی پێدەگات؛ بەو کابرایەی کە قسەکەی

پێڕادەگەیەنێت دەفەرموێت: " ئەو قسەیە وازلێبێنە، بوخاری هی وەک خۆی بە چاو نەدیوە".

❃ ڕەجائی کوڕی ڕەجاء فەرموویەتی: "بوخاری ئایەتێکە لە ئایەتەکانی خودا و بەسەر زەویدا ڕێدەکات".

❃ ئیمامی ئەبوعەبدوڵڵای حاکم لە کتێبی (تاریخ نیسابور) دا دەفەرموێت: "بوخاری پێشەوای ئەهلی حەدیسە، بە بێ هیچ ناکۆکییەک لە نێوان ئەهلی نەقڵدا".

❃ پێشەوای پێشەوایان ئیبن خوزەیمە دەفەرموێت: "لە ژێر ئاسمانێدا کەسم نەدیوە کە لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری زاناتر بێت بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)، یان لە ئەو حافیزتر بێت".

❃ حافیز زەهەبی لە (تذكرة الحفاظ) دەفەرموێت: "بوخاری لە زیرەکی و زانست و خواپەرستیدا سەرۆکێک بوو". هەر ئیمامی زەهەبی لە کتێبی (العبر) دا دەفەرموێت: "بوخاری یەکێک بوو لە چراکانی زانست و بەردەوام لە

زیرەکیدا دەدرەوشایەوە، کەسی وەک خۆیشی لەپاش خۆ بەجێنەهێشتووە".

❃ حافیز ئیبن حەجەر لە کتێبی (تقريب التهذيب) دەفەرموێت: "ئەبوعەبدوڵڵای بوخاری؛ چیای حیفز و پێشەوای دونیا و جێباوەڕی فەرموودەیە".

❃ حافیز ئیبن کەسیر لە کتێبی (البداية والنهاية) دا دەڵێت: "بوخاری پێشەوای ئەهلی حەدیسی سەردەمی خۆی و، بەپێشەنگکراوی ڕۆژگاری خۆی و، پێشخراو لە گشت هاوشان و هاوتاکانی"، هەروەها دەڵێت: "بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێبێت) ئەوپەڕی بەشەرم و دلێر و دەستبڵاو و پارێزکار و دونیانەویست و دوارۆژویست بوو".

❃ ئیبنوسسوبکی لە (طبقات الشافعية) دا دەڵێت: "بوخاری پێشەوای موسوڵمانان و پێشەنگی یەکخواپەرستان و شێخی ئیماندارانە، پشتپێبەستراوە لە فەرموودەکانی سەرداری پێغەمبەران (ﷺ) دا و پارێزەری شیرازەی دینە".

❁ موحەممەدی کوڕی یەعقووبی ئەخرەم دەڵێت: گوێم لێبوو هاوەڵانمان دەیانگوت:"کاتێک بوخاری چووە بۆ نیساپوور؛ چوار هەزار ئەسپسوار پێشوازییان لێکردووە، ئەمە جگە لە ئەوانەی کە سواری هێستر و گوێدرێژ بوون، هەروەها جگە لە خەڵکی پیادەڕەو".

❁ ئەمەی کە خستمانە ڕوو تەنها مشتێکە لە خەرمانێک، لەوەی کە لە بارەی ئیمامی بوخاریەوە گوتراوە، خودای گەورە بە ڕەحمەتی فراوانی ڕەحمی پێ بکات.

## ❁ کتێب و دانراوەکانی

❁ ئیمامی بوخاری (بە ڕەحمەت بێت) بە کتێبگەلێکی گرانبەها و بەکەڵکی؛ کتێبخانەی ئیسلامیی ڕازاندۆتەوە.

❁ بەپێزترینی ئەو پەرتووکانە و لە سەرووی هەمویانەوە سەحیحەکەیەتی (الجامع الصحیح)، کە دروستترین پەرتووکی دانراوە لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ).

❄ **دانراوەکانی دیکەی:** (الأدب المفرد) **و** (رفع اليدين في الصلاة) **و** (القراءة خلف الإمام) **و** ( بر الوالدين) **و** (التأريخ الكبير) **و** (التأريخ الأوسط) **و** (التأريخ الصغير) (خلق أفعال العباد) **و** (الضعفاء) **و** (الجامع الكبير) **و** (المسند الكبير) **و** (التفسير الكبير) (كتاب الأشربة) **و** (كتاب الهبة) **و** (أسامي الصحابة)، **جگە لەمانەش دانراوی دیکەی زۆرن، حافیز ئیبن حەجەر (بە ڕەحمەت بێت) لە** (مقدمة فتح الباري) **دا زۆرێکیانی ناوهێناون.**

## ✵ گرنگیدانی زانایان بە ناساندنی و باسکردنی دەنگوباسی

❄ **کاتێک کە ئیمامی بوخاری (بە ڕەحمەت بێت) هەڵسا و یەگجار خەمخۆرانە دەستی دایە کۆکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و پاککردنەوەی لە گەرد و خەوش، هەروەها پاکماڵی فەرموودە دروستەکان، کە بوخاری ئاوها بوو؛**

## ئیمامی بوخاری و سەحیحەکەی

خودای گەورەش ستایشی چاکەی لە نێو خەڵکیدا پێ بەخشی، دەبینیت کە هەر لە سەردەمی ئیمامی بوخاری خۆیەوە هەتاکوو ئێستاش ستایشی چاکەی دەکەن و ڕەحمەتی بۆ دەنێرن و ئەوپەڕی گرنگی دەدەن بە سەحیحەکەی، هیچ پەرتووکێکی مێژوو و ژیاننامەی مەردان نییە کە دانەرەکەی کتێبەکەی نەڕازاندبێتەوە بە ناساندنی ئیمامی بوخاری و باسی ژیاننامەی و گێڕانەوەی دەنگوباسی، سا ڕەحمەتی خودای لێبێت.

❁ حافیز زەهەبی (بە ڕەحمەت بێت) پاش ناساندنی و باسکردنی شتێک لە ژیاننامەی بوخاری؛ لە کتێبی (تذكرة الحفاظ) دا دەڵێت: "لێهاتووییەکانی ئەم ئیمامەم لە بەشێکی سەربەخۆی گەورەدا باسکردووە، کە شتی سەیری تێدایە".

❁ حافیز ئیبن حەجەریش لە سەروبەندی ناساندنی و باسکردنی ژیاننامەیدا، لە کتێبی (تهذيب التهذيب) دا دەڵێت: "لێهاتووییەکانی بوخاری گەلێک زۆرن، لە کتێبێکی

سەربەخۆدا کۆمکردووەتەوە و پوختەیەکیشیم لە کۆتایی ئەو کتێبەدا باسکردووە، کە لەمەڕ فەرموودە هەڵپەساردەکانی (الجامع الصحیح) دامناوە"، هەروەها لە کۆتایی کتێب (هدي الساري مقدمة فتح الباري) دا ژیاننامەی تۆمار کردووە و پاش گێڕانەوەی هەندێک ستایشی شێخ و هاوشانەکانی لەمەڕ بوخاری؛ دەڵێت: "ئەگەر بێم و دەرگای ستایشی پێشەوایانی پاش بوخاری دەربارەی بخەمە سەرپشت؛ ئەوە کاغەز تەواو دەبێت و هەناسە دەبڕێت، ئاخر ئەوە دەریایەکە و لێواری نییە".

❁ حافیز ئیبن کەسیریش لە کتێبی (البداية والنهاية) دا، لە باسی ناودارانی ساڵی دووسەد و پەنجا و شەشدا؛ باسی دەکات و دەڵێت: "ژیاننامەیەکی دووروودرێژیمان لە سەرەتای شەرحی سەحیحەکەیدا باسکردووە، با لێرەشدا کورتەیەکی کەمی بخەینە ڕوو"، ئەوجا لە سێ لاپەڕەدا باسی دەکات.

❁ **هەروەها ئیبنوسسوبکی لە** (طبقات الشافعية الكبرى) **دا ژیاننامەی دەخاتەڕوو و ژمارەیەک لە جوامێرییەکانی باس دەکات و پاشان دەڵێت: "ئەوەش بزانە کە جوامێرییەکانی ئەبوعەبدوڵڵا - واتە بوخاری - هێندە زۆرە کە تەنانەت ناتوانین زۆربەیشی باس بکەین چ جای هەمووی، پەرتووکەکان ئاخنراون دەربارەی ئەم پیاوە، بەڵام ئەوەندەی کە باسمان کرد بەسە و مەبەستی خۆی پێکاوە".**

❁ **جێی خۆیەتی لێرەدا خشتەیەک بخەمە بەردەستی خوێنەر بەڕێز، تا ئەو کتێبە چاپکراوانەی کە باسی بوخاری و دانراوەکانی ئەویان تێدایە پێی بخەمە ڕوو، لەگەڵ مێژووی مردنی دانەرەکەیان و ژمارەی ئەو لاپەڕانەی کە بۆ باسی بوخاری تەرخان کراون لێیان، بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێک پێی خۆش بێت زیاتر لەبارەیەوە شارەزا بێت بزانێت لە کوێدایە، هەروەها بشزانرێت کامە درێژە و کامەش کورتە، ئەویش بەم شێوەیە:**

| لاپەڕە | ناوی کتێب | مردنی | دانەر |
|---|---|---|---|
| ٣١ | تاريخ بغداد | ٤٦٣ك | الخطيب البغدادي |
| ٩ | طبقات الحنابلة | ٥٢٦ ك | القاضي محمد بن أبي يعلى |
| ٣ | وفيات الأعيان | ٦٨١ك | ابن خلكان |
| ٢ | تذكرة الحفاظ | ٧٤٨ك | الحافظ الذهبي |
| ١٨ | طبقات الشافعية الكبرى | ٧٧١ك | ابن السبكي |
| ٣ | البداية والنهاية | ٧٧٤ك | الحافظ ابن كثير |
| ١٧ | هدي الساري | ٨٥٢ك | الحافظ ابن حجر العسقلاني |
| ٩ | تهذيب التهذيب | ٨٥٢ك | الحافظ ابن حجر العسقلاني |
| ٤ | المنهج الأحمد | ٩٢٨ك | العليمي الحنبلي |
| ٢ | شذرات الذهب | ١٠٨٩ك | ابن العماد الحنبلي |
| ٣ | التاج المكلل | ١٣٠٧ك | صديق حسن خان |

## ❁ مردنی و ماوەی تەمەنی:

❁ بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێبێت) لە گوندێک لە گوندەکانی سەمەرقەند بەناوی (خەرتەنک) کۆچی دوایی کرد، لە پاش نوێژی عیشای شەوی شەممە کە سبەینێ جێژنی ڕەمەزان دەبوو، ئیدی پاش نوێژی نیوەڕۆی ڕۆژی جێژن بە خاک سپێردرا، ئەمە لە ساڵی: دووسەد و پەنجا و شەش ٢٥٦ ی کۆچی، لە تەمەنی شەست و دوو ٦٢ ساڵیدا، سیازدە ڕۆژی کەم بێت.

❁ حافیز ئیبن کەسیر لە کتێبی (البداية والنهاية) دا دەڵێت: "بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێبێت) زانستێکی بەسوودی لە پاش خۆی بە جێهێشت بۆ تێکڕای موسوڵمانان، جا زانستەکەی ئەو ئێستەش هەر نەبڕاوەتەوە، بەڵکوو بەردەوامە، لەبەر ئەو ماندووبوونەی کە لە ژیانیدا لە پێناویدا چەشتی". پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: (( مرۆڤ کە

## ئیمامی بوخاری و سەحیحەکەی

مرد یەکسەر کردەوەی دەپچڕێت، لە سێ شتدا نەبێت: زانستێک کە سوودی لێوەربگیرێت ..)) موسلیم گێڕاویەتیەوە.

سوپاس بۆ خودای گەورە لێرەدا باسی ئیمامی بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێبێت) تەواو بوو، لێرە بەدواوە ئیدی باسی سەحیحەکەیەتی.

# ﴿سەحیحی بوخاری﴾

## ❁ ناوی سەحیحی بوخاری:

❁ ئەم کتێبەی ئیمامی بوخاری کە لەمەڕ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دایناوە؛ لای خەڵکی هەر لە کۆنەوە هەتا ئێستاش بە (صحيح البخاري) بەناوبانگە.

❁ بەڵام لای بوخاری خۆی (ڕەحمەتی خودای لێبێت)؛ ناوی بریتییە لە: (الجامع الصحيح) واتە : (کۆگەی دروست)، بەو پێیەی کە لە باسی پاڵنەری دانانیدا گوتوویەتی، ناویشی ناوە: (الجامع الصحيح المسند من حديث رسول الله (ﷺ) وسننه وأيامه) واتە: (کۆگەی دروستی گەیەندراو لە فەرموودەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و سوننەت و ڕۆژگارەکانی)، هەروەک حافیز ئیبن حەجەر لە پێشەکیی کتێبی (فتح الباري) دا باسیکردووە.

❁ ئیبن سەلاح لە کتێبی (علوم الحديث) دا دەڵێت: بوخاری ناوی ناوە: (الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور

رسول الله صلى الله عليه وسلم وسننه وأيامه) **واتە: (کۆگەی گەیەندراوی دروستی کورتکراوە لە کاروباری پێغەمبەری خودا (ﷺ) و سوننەت و ڕۆژگارەکانی).**

## ۞ چ هۆکارێک پاڵی بە ئیمامی بوخارییەوە ناوە بۆ دانانی:

۞ **حافیز ئیبن حەجەر لە پێشەکیی کتێبی** (فتح الباري) **دا سێ هۆکاری باسکردووە کە پاڵی بە ئیمامی بوخارییەوە ناوە بۆ دانانی کتێبی** (الجامع الصحيح):

**یەکەم: ئیمامی بوخاری سەیری کرد کە ئەو پەڕتووکانەی پێش ئەو دانراون جگە لە سەحیح و حەسەن لاوازی زۆریشیان لە خۆگرتووە، دەڵێت: ئەمە هانی دا بۆ کۆکردنەوەی فەرموودەی سەحیح کە هیچ سەرڕاستێک گومانی لێی نەبێت.**

دووەم: دەڵێت: هەروەها گوتەیەکی مامۆستاکەی (ئەمیری ئیمانداران لە فەرموودە و فیقهدا: ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی حەنزەلی) ناسراو بە ئیبن ڕاهەوەیهـ کە فەرمووی: (ئەگەر پەڕتووکێکی کورتتان بۆ سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کۆبکردایەوە باش بوو)، ئەمە ورەی بەرزتر کرد بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، خۆی فەرموویەتی: "ئەم قسەیە دڵی گرتم، هەربۆیە دەستم دایە کۆکردنەوەی فەرموودەی سەحیح".

سێیەم: بە ئیسنادی جێگیر هاتووە، لە موحەممەدی کوڕی سولەیمانی کوڕی فارسەوە، دەڵێ: گوێم لە بوخاری بوو دەیگوت: "لە خەودا پێغەمبەر (ﷺ) م بینی، لە بەردەمیدا ڕاوەستا بووم و باوەشێنێکم پێبوو و خەریک بووم پاسم دەکرد، دوایی لە خەوبژێرێکم پرسی، پێی گوتم: تۆ درۆی لێ دوور دەخەیتەوە، ئەمە پاڵی پێوەنام بۆ بەرهەمهێنانی پەڕتووکی (الجامع الصحيح)".

## ۞ ڕادەی تۆکمەکاری بوخاری لە دانانیدا:

❁ بوخاری (ڕەحمتی خودای لێبێت) هەموو هەوڵێکی خستبووە گەڕ لە تۆکمەکاری لەم پەڕتووکە مەزنەدا، ڕادەی ئەم تۆکمەکارییەی لەوەدا دەردەکەوێت کە زانایان لێوەیان گێڕاوەتەوە.

❁ فەرەبری لێوەی دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: "هیچ فەرموودەیەکم نەخستووەتە ناو پەڕتووکە سەحیحەکەمەوە تا خۆمم نەشۆردبێت و دوو ڕکات نوێژم نەکردبێت".

❁ عومەری کوڕی موحەممەدی بوحەیریش دەگێڕێتەوە کە بوخاری فەرموویەتی: "هیچ فەرموودەیەکم تێدا تۆمار نەکردووە (واتە لە (الجامع الصحيح) دا)، تا لە خودا نەپاڕابێتمەوە و دوو ڕکات نوێژم نەکردبێت و دڵنیا نەبووبم لە دروستیی ئەو فەرموودەیە".

❁ هەروەها عەبدولڕەحمانی کوڕی ڕەساینی بوخاری دەگێڕێتەوە کە بوخاری فەرموویەتی: "پەڕتووکە

سەحیحەکەمم بە شازدە ساڵ داناوە و لە شەشسەد هەزار فەرموودە دەرمهێناوە، وە کردوومە بە بەڵگە لە نێوان خۆم و خودای گەورەدا".

## ❁ بابەتی (الجامع الصحیح):

❁ بابەتی کتێبی (الجامع الصحيح) بریتییە لە فەرموودەی دروست و ڕاستی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، چونکە بوخاری گرنگیی سەرەکیی بەمە دەدا و کتێبەکەشی کردە کۆگەی ئەم فەرموودانە، بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە بریتییە لە:

١ـ خۆی ناوی لێناوە: (الجامع الصحيح المسند من حديث رسول الله (ﷺ) وسننه وأيامه) واتە: (کۆگەی دروستی گەیەندراو لە فەرموودەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و سوننەت و ڕۆژگارەکانی).

٢ـ بوخاری خۆی ڕاشکاوانە ئەمەی لە زۆر گوتارێکیدا دووبارە کردۆتەوە، هەندێکیمان لە باسی هۆکارەکانی دانانی و

ڕادەی تۆکمەکاریدا باسکرد، هەر لەو بارەیەوە ئیسماعیلی دەگێڕێتەوە کە بۆخاری فەرموویەتی: "ئەم پەڕتووکەم بەرهەم نەهێناوە بە سەحیحی نەبێت، ئەو فەرموودە سەحیحانەش کە وازم لێهێناون زۆرترن"، هەروەها ئیبراهیمی کوڕی مەعقیل دەگێڕێتەوە کە بوخاری فەرموویەتی: "لەم پەڕتووکەمدا سەحیح نەبێت تۆمارم نەکردووە، سەحیحی زۆریشم وازلێهێناوە بۆ ئەوەی درێژ نەبێتەوە".

❁ سەرەڕای فەرموودەی سەحیح کە بابەتی پەڕتووکەکەیە؛ شتی دیکەشی لەخۆگرتووە، لە پێڕستی بابەکاندا لە لێدوان و وەرگرتنی حوکم و هێنانەوەی وتەی سەلەف و شتی دیکەش کە لە بابەتی سەرەکیی پەڕتووکەکەی نییە، حافیز ئیبن حەجەر لە (مقدمة فتح الباري) دا پاش ئاماژەدان بە بابەتی ئەم پەڕتووکە دەڵێت: "پاشان وای بینی کە لە کەڵکی فیقهی و خاڵی پەندامێزی نەبوێرێت، هەربۆیە بە تێگەیشتنی خۆی واتای زۆری لە

دەقەکان وەرگرتووە و دابەشی کردووە بەسەر بابەکانی پەڕتووکەکەدا، بە گوێرەی گونجایشیان، هەروەها گرنگیی داوە بە ئایەتەکانی ئەحکام و ئاماژەی ناوازەی لێوەرگرتوون و لە تەفسیریاندا ڕێگەی بەرینی گرتووەتەبەر".

❋ بەم چەشنە ئیمامی بوخاری (ڕەحەمتی خودای لێبێت) لە پەڕتووکی (الجامع الصحيح) دا هەردوو لایەنی گێڕانەوە و لێکدانەوەی کۆکردۆتەوە، لە پاراستنی سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و تێگەیشتنیشی.

## ❋ فەرمووده هەڵپەساردەکان (التعليقات) لە سەحیحی بوخاریدا:

❋ هەڵپەساردن (تعليق) بریتییە لە لابردنی گێڕەوە (راوي) یەک یان پتر لە سەرەتای سەنەددا.

❋ هەڵپەساردە لە سەحیحی بوخاریدا زۆرن بە پێچەوانەی سەحیحی موسلیم کە زۆر کەمی تێدایە.

❃ حافیز ئیبن حەجەر پەڕتووکێکی داناوە لەمەڕ گەیاندنەوەی هەڵپەساردەکانی بوخاری و ناوی ناوە (تغليق التعليق) واتە: (داخستنی هەڵپەساردن)، وە لە تەوەرێکی درێژدا لە (مقدمة فتح الباري) دا کورتی کردووەتەوە، هەڵپەساردە بەرزکراوە (مرفوع) ەکانی تێدا باس کردووە و ئاماژەی بەوە داوە کە کێ گەیاندوویەتی، هەروەها موتابەعاتیش، چونکە حوکمی ئەمیش هەروەک هەڵپەساردە وایە، لە سەرەتای تەوەرەکەدا دەڵێت: "ئەمەم هەموو بە فراوانی باس کردووە لە دانراوێکی گەورەدا کە ناوم لێناوە (تغليق التعليق)، هەموو فەرموودە بەرزکراوەکان و شوێنەوار (أثر) ە ڕاگیراو (موقوف) ەکانم تێدا باسکردووە، لە گەڵ باسکردنی ئەوەی کە کێ گەیاندوویەتی بە ئەسانیدی خۆم تا شوێنی هەڵپەسێردراو، جا پەڕتووکێکی گشتگیر و کۆگەیەکی تێروتەسەلی لێدەرچووە" تائەوەی کە دەڵێت: "کەسیش شک نابەم خۆی دابێت لە قەرەی دانانی ئاوەها پەڕتووکێک"، هەر

لە کۆتایی تەوەرەکەدا، پاش لێبوونەوە لە خستنە ڕووی هەموو فەرموودە هەڵپەساردەکان دەڵێت: "وە هەر هەڵپەساردەیەک کە لە شوێنێکی دیکەی سەحیحەکەی یان پەڕتووکێکی دیکەی خۆیدا بەدەر لە سەحیحەکە گەیاندبێتی؛ ڕوونم کردووەتەوە، هەرچییەکیش لە خۆیەوە گەیاندنیم دەست نەکەوتبێت؛ ئەوە ڕوونم کردووەتەوە کە کێی دیکە لە ئیمامەکان گەیاندوویانە لە دانراوەکانیاندا" تا کۆتایی قسەکەی (ڕەحمەتی خودای لێبێت).

❁ جا سەرەنجامی بڕیاردان لەسەر هەڵپەساردەکان بەم شێوەیە دەبێت:

❐ هەرکامێکیان بە ڕێژەی ڕاشکاوی بێت، وەک: گوتی، گێڕایەوە، هاتووە و هی لەم چەشنە کە کردارەکەی کارادیار (المبني للمعلوم) بێت؛ ئەوە سەحیحە تا ئەو کەسەی کە لێوەی هەڵپەساردووە و تا ئەوێ خەوشی نییە، ئیدی وردبوونەوە لەوەولای دەکرێت.

❑ هەرکامێکیشیان بە ڕێژەی بیماراندن (التمريض) بێت، وەک: گوتراوە، گێڕدراوەتەوە، دەگێڕدرێتەوە، باسدەکرێت و لەم چەشنە کە کردارەکەی کارانادیار (المبني للمجهول) بێت؛ ئەوە هیچ کام لە سەحیح بوون یان نەبوون ناگەیەنێت، حافیز ئیبن کەسیر بەم شێوەیە لە پەڕتووکی (الباعث الحثيث في اختصار علوم الحديث) دا باسی کردووە و گوتوویەتی: "چونکە فەرموودەی وای تێدایە کە بەم ڕێژەیە هاتووە کەچی سەحیحە هەندێک جاریش موسلیم گێڕاوێتییەوە"، حافیز ئیبن حەجەریش لە (مقدمة فتح الباري) دا گوتوویەتی: "ڕێژەی دووەم بریتییە لە ڕێژەی بیماراندن (التمريض)، ئەم ڕێژەیە سەحیحێتی ناگەیەنێت تا ئەو کەسەی کە لێوەی هەڵپەساردووە، بەڵکوو تێیدایە سەحیحە و تێشیدایە سەحیح نییە".

## ❁ ژمارەی فەرموودەکانی سەحیحی بوخاری:

❁ حافیز ئیبن حەجەر لە (مقدمة فتح الباري) دا ژمارەی فەرموودە بەرزکراوەکان و هەڵپەساردەکانی نێو سەحیحی بوخاریی نووسیوە و ڕوونی کردووەتەوە، هەم بە کورتی هەم بە درێژی، جا فەرمووا پوختەی ئەو دەرەنجامەی کە ئەو پێی گەیشتووە لێرەدا بە کورتی دەیخەمە پێش چاو:

١- ژمارەی فەرموودە بەرزکراوە گەیەندراوەکان بە دووبارەبووەکانەوە: ٧٣٩٧ فەرموودە.

٢- ژمارەی فەرموودە بەرزکراوە هەڵپەساردەکان بە دووبارەبووکانەوە: ١٣٤١ فەرموودە.

٣- ژمارەی هەموو موتابەعات و سەرنج لەسەر جیاوازیی گێڕانەوەکان: ٣٤٤ فەرموودە.

٤- ژمارەی هەموو گەیەندراو و هەڵپەسارده و موتابەعاتە بەرزکراوەکان بە دووبارەبووەکانەوە: ٩٠٨٢ فەرموودە.

٥ـ ژمارەی فەرموودەی بەرزکراوەی گەیەندراو بەبێ دووبارە: ٢٠٦٠٢ فەرموودە.

٦ـ ژمارەی فەرموودەی هەڵپەساردە بەبێ دووبارە: ١٥٩ فەرموودە.

٧ـ ژمارەی فەرموودەی بەرزکراوە چ گەیەندراو چ هەڵپەساردە بەبێ دووبارە: ٢٧٦١ فەرموودە.

❁ ئەم ئامارە تەنها فەرموودە بەرزکراوە (مرفوع) ە کان دەگرێتەوە، بەبێ ئەو شوێنەوار (أثر) انەی کە لە هاوەڵان و دواهاوەڵان و دواتریشەوە هاتوون.

❁ حافیز ئیبن حەجەر پاش باسکردنی هەموو فەرموودەکان بەبێ دووبارەکان دەڵێت: "ئەم ژمارەیەی کە من باسم کردووە لە گەڵ ئەو ژمارەیەی کە ئیبن سەڵاح و کەسی دیکەش باسیانکردووە؛ جیاوازیی زۆریان لە نێواندایە"، مەبەستی لێرەدا ئەو قسەیەی ئیبن سەڵاحە کە لە (علوم الحديث) دا دەفەرموێت: "گوتراویشە کە بە لابردنی

دووبارەکانەوە چوار هەزار فەرموودەن"، پاشان حافیز ئیبن حەجەر لە هۆی ئەم جیاوازییەدا دەڵێت: "پێدەچیت ئەم ژمارەیەی یەکەم کە لاسایی ئەمیان تێدا کردووەتەوە؛ لەوەوە بێت کە ئەگەر فەرموودەکەی بە درێژی لە شوێنێکدا دیتبێت و لە شوێنێکی دیکەدا بە کورتی، ئیدی وایزانیوە کە ئەم کورتەیە جیایە لە درێژەکە، ئەمەش لەبەر دووریی ماوەی نێوانیان، یان لەبەر کەم شارەزایی لەم پیشەیەدا بووە، چونکە پەڕتووکەکە شتی لەم چەشنەی زۆر تێدایە، ئەو کاتەش جیاوازیی نێوان هەردوو ئامارەکە ڕوون دەبێتەوە، هەر خوداش تۆفیقدەرە"، قسەی حافیز ئیبن حەجەر تەواو بوو، خودا ڕحمی پێ بکات و لێی خۆش ببێت و باشترین پاداشتی بداتەوە لەو ڕاژە تەواوەی بۆ سوننەت پێغەمبەر (ﷺ) و بە تایبەتیش ڕاژەی دروستترین پەڕتووکی فەرموودە.

## ❁ نهێنی لە دووبارە کردنەوەی فەرموودەیەک لە جێگایەک یان چەند جێگایەکی سەحیحی بوخاریدا:

❁ دیارە کە بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێبێت) نەیوستووە تەنها فەرموودە ڕیز بکات، بەڵکوو سەرەڕای کۆکردنەوەی فەرموودەی سەحیح، ویستوویەتی حوکم وحیکمەتیشی لێوەربگرێت، هەربۆیە حوکمێک لە فەرموودەیەک وەردەگرێت و دەیکات بە سەردێڕ و پاشان فەرموودەکەی لە ژێردا بە بەڵگە دەهێنێتەوە، حوکمێکی دیکەشی لێوەردەگرێت و دەیکات بە سەردێڕ و جارێکی دیکە هەمان فەرموودە بە بەڵگە دەهێنێتەوە.

❁ بەڵێ کە دووبارەکردنەوەکە بە مەبەستی بەڵگەهێنانەوەیە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە سوودی دیکەی تێدا نییە، بەڵکوو سوودێکی دیکەی تێدایە ئەویش ئەوەیە کە فەرموودەکە لە شێخێکی دیکەوە دەگێڕێتەوە، ئەمەش سوودی فرەڕێچکەیی (تعدد الطرق) تێدایە بۆ ئەو

فەرموودەیە، لەم بارەیەوە حافیز ئیبن حەجەر لە پێشەکیی (فتح الباري) دا دەگێڕێتەوە کە حافیز ئەبولفەزڵ ئیبن تاهیری مەقدیسی گوتوویەتی: "بوخاری کەمجارانێک یەک فەرموودە لە دوو جێگادا بە یەک ئیسناد و یەک بێژە دەهێنێتەوە"، حافیز ئیبن حەجەریش ئەوەی باس کردووە کە ئەمەی زۆر کەم لێ ڕووداوە.

❀ دانەری (کشف الظنون) یش دەڵێت: "ئەو فەرموودانەی کە بە سەنەد و (متن) دەقەوە دووبارەی کردوونەتەوە بیست و سێ فەرموودەن".

❀ بوخاری مەبەستی دیکەشی هەیە لە دووبارەکردنەوەی فەرموودە لە جێگەیەک یان چەند جێگەیەکدا، حافیز ئیبن حەجەر لە (مقدمة فتح الباري) دا زۆرێکی باس کردوون.

## ۞ سەردێڕەکان (تراجم) ی سەحیحی بوخاری

۞ حافیز ئیبن حەجەر پەسنی سەردێڕەکان (تراجم) ی سەحیحی بوخاری وا داوە کە هزرەکان دەپەشۆکێنن و هۆش و چاوان دەحەپەسێنن، هەروەها کە ئەستەمەکار و بێوێنەن، بە جۆرێک کە تاقەسوارە لە وردەکاری تێیاندا و بەناوبانگە پێیان (بەم سەردێڕانە) پتر لە هاوشانەکانی، وە لە (مقدمة فتح الباري) دا بە درێژی قسەی لەم بارەیەوە کردووە، وە ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە سەردێڕی وا هەیە ڕاستەوخۆ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لە خوارەوەیدا هێناویەتی، هەندێک جاریش هەر بە بێژەی خواردێڕەکەیە (واتە بێژەی ئەو فەرموودە و شوێنەوارانەی کە لە خوارەوەیدا دەیهێنێتەوە) یان بە بەشێکی یان بە واتاکەی، زۆر جارانیش بە شێوەی پرسیار سەردێڕ دادەنێت (لە نێوان دوو پرسدا)، بەجۆرێک کە بڕیار لەسەر هیچ کامێکیان نادات، هەروەها زۆر جاریش سەردێڕێکی وا دادەنێت کە مەبەستەکەی ڕوون نییە مەگەر بە

تێڕامان، وەک سەردێڕی: (باب قول الرجل ما صلينا) واتە: (بابی ئەوەی کە پیاو بڵێت: نوێژمان نەکردووە) لێرەدا مەبەستی بەرپەرچدانەوەی ئەوانەیە کە دەڵێن نابێت وا بڵێیت، زۆر جاریش سەردێڕەکە ئاماژەیە بۆ واتای فەرموودەیەک کە بە پێی مەرجی ئەو سەحیح نییە، یان بە ڕاشکاوی بە بێژەی ئەو فەرموودەیە دەبێت کە بە پێی مەرجی ئەو سەحیح نییە، وە لە بابێکدا شتی وا دەهێنێتەوە کە جارێک واتاکەی بە شتێکی ئاشکرا بەدەستەوە دەدات، جارێکیش بە شتێکی شاراوە، جاری واش هەیە تەنها هەر سەردێڕەکە دادەنێت بە بێژەی فەرموودەیەک کە بە مەرجی خۆی سەحیح نییە، ئەوجا لە خوارەوە شوێنەوار (أثر) ێک یان ئایەتێک دەهێنێتەوە، وەک ئەوەی کە بڵێت هیچ شتێکی سەحیح لەم بارەیەوە نییە کە لەسەر مەرجی ئەو بێت، جا لەبەر ئەمانە و شتی دیکەش زۆرجار خەڵکانێکی بەڕێز

دەڵێن: "فقه البخاري في تراجمه"، **واتە: "فیقهی بوخاری لە سەردێڕەکانیدایە".**

## ❁ مەرجی بوخاری لە سەحیحەکەیدا

❁ **حافیز ئیبن حەجەر لە** (مقدمة فتح الباري) **دا بە سەنەدی خۆی دەگێڕێتەوە کە حافیز ئەبولفەزڵ ئیبن تاهیری مەقدیسی فەرموویەتی: "واتە مەرجی بوخاری ئەوەیە کە فەرموودەیەک بگێڕێتەوە کە هەمووان کۆک بن لەسەر باوەڕپێکراویی بگێڕەوە** (راوي) **ەکانی تا دەگاتە هاوەڵە بەناوبانگەکە** (الصحابي المشهور)، **بەبێ هیچ ناکۆکییەک لە نێوان باوەڕپێکراوە پشتقایمەکان** (الثقات الأثبات) **دا، وە سەنەدەکەی گەیشتوو** (متصل) **بێت و پچڕاو** (مقطوع) **نەبێت، وە ئەگەر لەو هاوەڵەوە دوو بگێڕەوە هەبن ئەوە باشترە، ئەگەر لە یەک بگێڕەوە پتریش نەبێت و تا دەگاتەوە ئەو دروست بێت ئەوەش هەر بەسە"، ئەمەی کە حافیز ئیبن**

حەجەر لە مەقدیسییەوە گێڕاویەتییەوە؛ مەقدیسی خۆیشی لە سەرەتای پەڕتووکەکەی (شروط الأئمة الستة) دا بە بێژەیەکی نزیک لەمەوە نووسیوێتی.

❁ وە حافیز ئیبن حەجەر لە (مقدمة فتح الباري) و شەرحی (نخبة الفكر) دا لە سەروبەندی پەسەندستنی سەحیحی بوخاری بەسەر سەحیحی موسلیمدا دەڵێت: "پەسەندیتنی لە ڕووی پێوەندی (الاتصال) ەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی مەرجی بوخاری وایە کە دەبێت گێڕەوە گەیشتبێت بەوەی کە لێوەی دەگێڕێتەوە، ئەگەرچی ئەو پێگەیشتنە بۆ تەنها جارێکیش بێت، بەڵام مەرجی موسلیم ئەوەیە کە تەنها هاوچەرخبوونیان بەسە"، وە لە شەرحی (نخبة الفكر) دا لە ژماردنی پلەکانی سەحیحدا دەڵێت: "پاشان لە ڕووی دروستییەوە هەرچییەک کە مەرجەکانی هەردووکیان — بوخاری و موسلیم — ی تێدا بێت؛ ئەوە پێش

دەخرێت، چونکە مەبەست گێڕەرەوەکانیانە لەگەڵ مەرجەکانی دیکەی سەحیحدا...".

## ❁ ستایشی زانایان لەسەر سەحیحی بوخاری لەگەڵ سەحیحی موسلیمدا

❄ حافیز لە سەرەتای (مقدمة الفتح) دا دەڵێت: "وە دیتم کە ئیمامی ئەبوعەبدوڵڵای بوخاری لە سەحیحەکەیدا هەستاوە بە وەرگرتنی نووری چەلەنگی قورئان و سوننەت، بە تەقریر و هەڵهێنجان، وە بە هەڵهێجان لە سەرچاوە لێوانلێوەکانیان، بە دارِنین و پاککردن، وە بە هۆی نیازی پاکییەوە خۆشبەختیی پێ بەخشرا، تا یار و نەیار ملی بۆ دادا و وتەکانی نێو سەحیحەکەی بە هەموو چەشنێک وەرگرت.." هتد.

❄ وە حافیز ئیبن کەسیر لە (البداية والنهاية) دا دەڵێت: "زانایان کۆکن لە سەر قەبووڵکردنی سەحیحی بوخاری و

دروستیی ئەوەی کە تێیدایە، هەروەها تێکڕای ئەهلی ئیسلام...".

❁ وە ئیبنوسسوبکی لە (طبقات الشافعية الكبرى) دا دەڵێت: "سەحیحی بوخاری بەپێزترینی پەڕتووکەکانی ئیسلامە پاش قورئانی پیرۆز...".

❁ وە ئەبوعەمر ئیبن سەڵاح لە (علوم الحديث) دا پاش باسی ئەوەی کە یەکەم کەسێک کە پەڕتووکی لەمەڕ فەرموودەی سەحیحدا داناوە بوخارییە پاشان موسلیم؛ دەڵێت: "هەردوو پەڕتووکەکەی بوخاری و موسلیم دروستترین کتێبن پاش قورئانی پیرۆز" پاشان دەڵێت: "پاشان پەڕتووکەکەی بوخاری دروستترینیانە و کەڵکی زۆرتری تێدایە".

❁ وە نەوەوی لە پێشەکیی شەرحی سەحیحی موسلیمدا دەڵێت: "زانایان - ڕەحمەتی خودایان لێ بێت – کۆکن لەسەر ئەوەی کە دروستترین پەڕتووک لە پاش قورئانی

عەزیز بریتییە لە هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیم، وە ئۆمەتی ئیسلام باوەشی قەبووڵیان بۆ کردوونەتەوە، وە سەحیحی بوخاری دروسترە لە هی موسلیم و کەڵک و زانیاری ڕوونیش و لێڵیشی زۆرتر تێدایە، وە هەواڵ هاتووە کە موسلیم سوودی لە بوخاری وەردەگرت و دانی بەوەدا دەنا کە هاوشێوەی نییە لە زانستی فەرموودەدا".

❁ وە ئیبنولعیماد لە (شذرات الذهب) دەگێڕێتەوە کە حافیز عەبدولغەنی ئەلمەقدیسی لە پەڕتووکی (الكمال) گوتوویەتی: "ئیمامی ئەبوعەدوڵڵای جەعفیی بوخاری خاوەنی سەحیح، پێشەوا و پێشەنگی ئەم کارە و پەڕتووکەکەی پشتی پێبەستراوە لە نێو ئەهلی ئیسلامدا".

❁ وە ئیمامی شەوکانی لە سەرەتای کتێبی (قطر الولي على حديث الولي) دا دەڵێت: "پێویست ناکات قسە لەسەر پیاوانی ئیسنادەکەی بکەین، چونکە زانایانی ئەم کارە یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە فەرموودەکانی هەردووسەحیح

یان یەکێکیان هەمووی ڕاستییەکەی زانراوە و بە تەواوی قەبووڵ کراوە و بە یەکدەنگی هەمووی جێگیرە، وە لە ئاست ئەم یەکدەنگییانەدا هەموو گومان و دوودڵییەک دەڕەوێتەوە، وە گەورە پێشەوایان لە ڕووی هەموو ئەوانەدا وەستاون کە قسەیەکیان لەسەر شتێکی ئەم دوو کتێبە کردبێت، وە بە ڕوونترین چەشن بەرپەرچیان داونەتەوە، هەروەها دروستییان ڕوونکردوونەتەوە بە تێروتەسەلترین شێوە، جا قسەکردن لەسەر ئیسنادەکەی پاش ئەمە هەمووی؛ هیچ سوودێکی وای نابێت، چونکە هەموو گێڕەوەکانی لەو پردە تێپەڕیون و قسە و قسەلۆکیان لەسەر نەماوە، وە وایان لێهاتووە کە گەورەترن لەوەی قسەیان لەمەڕ بکرێت، یاخود توانج یان سووکایەتیی هیچ کەسێک بیانڕووشێنێت".

❁ ئەمە نموونەگەلێک بوو لە وتەی زانایان لە مەڕ سەحیحی بوخاری و ڕوونکردنەوەی پایەبەرزی و

قەبووڵکردنییەوە لە لایەن ئۆمەتەوە، هاوڕێ لەگەڵ سەحیحی موسلیمدا.

## ۞ ڕووەکانی پەسەندیتن (ترجیح) ی سەحیحی بوخاری بەسەر سەحیحی موسلیمدا:

❁ لە پێشەوە هەندێک وتەی زانایانمان هێنایەوە لەمەڕ لەپێشتریی هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیم بە سەر پەرتووکەکانی دیکەدا، وە لەمەڕ وەرگیرانیانەوە لە لایەن ئۆمەتەوە، بەڵام هەندێک لەو وتانە باسی لە لەپێشتریی سەحیحی بوخاریی دەکرد بەسەر هی موسلیمدا، ئەم پێشخستن و بەسەردا پەسەندیتنە لای زانایان شتێکی بڵاوە، ئەویش لەبەر چەند شتێک:

یەکەم: چونکە ئەوانەی کە بوخاری بە تەنها و بە بێ موسلیم فەرموودەی لێوە گێڕاونەتەوە؛ چوارسەد و سی و ئەوەندە کەسن، کە تەنها هەشتا کەسیان قسەیان لەسەر

کراوە لە ڕووی لاوازییەوە، بەڵام ئەوانەی کە موسلیم بە تەنها و بە بێ بوخاری فەرموودەی لێوە گێڕاونەتەوە؛ شەشسەد و بیست کەسن و سەد و شەست کەسیان قسەیان لەسەرکراوە لە ڕووی لاوازییەوە، جا بێگومان گێڕانەوە لە کەسێکەوە کە هیچ قسەی لەسەر نەکرابێت باشترە لە گێڕانەوە لە کەسێکەوە کە قسەی لەسەر کرابێت، ئەگەرچی ئەو قسەیە ڕووشێنەریش نەبێت.

دووەم و سێیەم: ئەو قسەلەسەرکراوانەی کە بوخاری بە تەنها گێڕانەوەی لێیانەوە هەبووە؛ بوخاری فەرموودەی زۆری لێیانەوە نەگێڕاوەتەوە، وە زۆربەیان لەو شێخانەی خۆی بوون کە پێیان گەیشتووە و لەگەڵیان کۆبووەتەوە و حاڵیانی زانیوە و گوێی لە فەرموودەکانیان بووە و فەرموودە چاکەکانیانی لە خراپەکانیان جیاکردووەتەوە، بەڵام موسلیم بە پێچەوانەوە، واتە هەم زۆری لێیانەوە گێڕاوەتەوە، هەمیش

زۆربەیان لە شێخەکانی خۆی نەبوون تا پێیان گەیشتبێت و فەرموودەکانی جیاکردبنەوە.

چوارەم: بوخاری بە مەرجی داناوە کە دەبێ گێڕەوە (راوي) گەیشتبێتە ئەو کەسەی کە لێیەوە گێڕاویەتییەوە، ئەگەر بۆ تەنها جارێکیش بێت، بەڵام موسلیم تەنها هاوچەرخبوونیانی بە بەس زانیوە، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە بۆ پەسەندیتنی بوخاری بەسەر موسلیمدا، لەبەر تۆکمەکاری و دڵنیابوونی زیاتر.

پێنجەم: ئەو فەرموودانەی کە ڕەخنەیان لێگیراوە لە بوخاریدا ژمارەیان کەمترە لە هی موسلیم، بێگومان ئەوەی کە ڕەخنەی کەمتری لێگیرابێت پەسەندترە لەوەی کە زۆرتری لێگیراوە.

❄ لەگەڵ ئەم ڕووانەشدا هاوڕایی زانایان لەسەر ئەوەی کە بوخاری زاناترە لە موسلیم لە فەرموودەوانیدا، هەروەها کە موسلیم قوتابی و شاگردی بوخاری بووە، هەر موسلیم خۆی

شاهێدیی دەدا بۆ بوخاری کە بەئەزموونترە لەم هونەرەدا و لە پێشەوایەتی لەم بوارەدا، حافیز ئیبن حەجەر لە (مقدمة الفتح) و شەرحی (نخبة الفكر) دا ئەم ڕووانە و هی دیکەشی ڕوونکردووەتەوە ...

❁ ئەم پەسەندیتنەی سەحیحی بوخاری بەسەر سەحیحی موسلیمدا؛ مەبەست پێی پەسەندیتنی تێکڕایە بەسەر تێکڕادا، نەک دانە دانەی فەرموودەکان، وەک سیوتی لە ئەلفییەکەیدا گوتوویەتی:

وربما يعرض للمفوق ما ... يجعله مساويا أو قدما

واتە: هەندێک جار هی بەسەرداپەسەندیتراو (سەحیحی موسلیم) یەکسان یاخود لەپێشتر دەبێت (لە سەحیحی بوخاری).

❁ لە نموونەی ئەمە، وەک لە شەرحی (نخبة الفكر) ی حافیز ئیبن حەجەر دا هاتووە؛ وەکوو ئەوەی کە فەرموودەکە

لای موسلیم مەشهوور بێت و بە پلەی تەواتور نەگەیشتبێت، بەڵام ئاماژەیەکی پێوەبێت کە بە هۆیەوە زانستی یەقینی بگەیەنێت، ئەمە پێش ئەو فەرموودەیەی بوخاری دەخرێت کە تاک و پەتی (فرد مطلق) بێت ...

❁ بەڵام ئەوەی کە لە هەندێک لە زانایانەوە دەگێڕدرێتەوە، لە پێشخستنی سەحیحی موسلیم بەسەر سەحیحی بوحاریدا؛ ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ جوانیی هۆنینەوە و چاکیی دانان و ڕێکخستن، نەک بۆ دروستتری، هەروەک زانایانی ئەم کارە باسیان کردووە...

## ❁ ژمارەی شێخەکان بوخاری لە سەحیحەکەیدا و چینەکانیان:

❁ نووسەری (کشف الظنون) ئەوەی باسکردووە کە ژمارەی ئەو شێخانەی بوخاری کە لە سەحیحەکەیدا فەرموودەی لێوە گێڕاونەتەوە؛ دووسەد و هەشتا و نۆ کەسن،

ئەوانەش کە بە تەنها و بە بێ موسلیم گێڕانەوەی لێیانەوە هەبووە؛ سەد و سی و چوارن.

❁ حافیزیش لە (مقدمة الفتح) دا ئەوەی باسکردووە کە شێخەکانی بوخاری لە پێنج چین پێکدێن:

چینی یەکەم: ئەوەی کە لە تابیعینەوە فەرموودەی بۆ گێڕاوەتەوە، وەکوو ئەم کەسانە:

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای ئەنساری لە حومەیدەوە بۆی گێڕاوەتەوە، مەکیی کوڕی ئیبراهیم لە یەزیدی کوڕی ئەبوعوبەیدەوە، ئەبوعاسیمی نەبیل ئەمیش هەر لە یەزیدی کوڕی ئەبوعوبەیدەوە، عوبەیدوڵڵای کوڕی موسا لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبوخالیدەوە، ئەبونوعەیم لە ئەعمەشەوە، خەللادی کوڕی یەحیا لە عیسای کوڕی تەهمانەوە، عەلیی کوڕی عەییاش و عیسامی کوڕی خالید هەردووکیان لە حەریزی کوڕی عوسمانەوە.

❁ شێخەکانی ئەمانە هەمووی لە ڕێزەی تابیعینن...

چینی دووەم: ئەوەی کە لە سەردەمی ئەوانەی چینی یەکەمدا بووبێت؛ بەڵام لە جێباوەڕان (ثقات) ی تابیعین بیستنیان نەبووبێت، وەکوو ئادەمی کوڕی ئەبوئیاس و ئەبوموسهیر عەبدولئەعلای کوڕی موسهیر و سەعیدی کوڕی ئەبو مەریەم و ئەییوبی کوڕی سولەیمانی کوڕی بیلال و هی وەک ئەمان...

چینی سێیەم: شێخەکانی ناوەڕاستی بوخاری، ئەوانەی کە نەگەیشتوون بە تابیعین، بەڵکوو بە گەورەکانی دوای تابیعین، وەکوو سولەیمانی کوڕی حەرب و قوتەیبەی کوڕی سەعید و نوعەیمی کوڕی حەمماد و عەلیی کوڕی مەدینی و یەحیای کوڕی مەعین و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهـ و ئەبوبەکری کوڕی ئیبن ئەبی شەیبە و عوسمانی کوڕی ئیبن ئەبی شەیبە و هی وەک ئەمان، موسلیم لەم چینەدا بەشداریی کردووە لە وەرگرتنی فەرموودە لێیان...

چینی چوارەم: هاوڕێیانی بوخاری خۆی یان ئەوانەی کە ماوەیەکی کەم پێش ئەو دەستیان داوبوویە فەرموودەخوازی، وەکوو موحەممەدی کوڕی یەحیای زوهلی و ئەبوحاتیمی ڕازی و موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحیمی ناسراو بە (صاعقة) و عەبدی کوڕی حومەید و ئەحمەدی کوڕی نەزر و کومەڵێکی هاوشێوەی ئەمانەش، ئەوەش کە لەمانەوە گێڕاوێتییەوە ئەوانە بووە کە خۆی لە کیسی چووە لە شێخەکانی یان لە غەیری ئەوانەوە دەستی نەکەوتبێت.

چینی پێنجەم: کەسانێک کە لە تەمەن و سەنەددا وەک شاگردی ئەو هەژمارن؛ بەڵام کە لێوەبیستنیان بەسوود بووە ئیتر لێوەی گێڕاونەتەوە، وەکوو عەبدوڵڵای کوڕی حەممادی ئامولی و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبولعاسی خواریزمی و حوسەینی کوڕی موحەممەدی قەببانی و غیری ئەمانیش.

❁ شتانێکی کەمیشی لەمانەوە گێڕاوەتەوە، گێڕانەوەشی لێیانەوە لە سۆنگەی ئەو وتەیەوە بووە کە عوسمانی کوڕی

ئەبوشەیبە لە وەکیعەوە گێڕاوێتییەوە کە فەرموویەتی: "مرۆڤ نابێتە زانا تا لە لەخۆی بانتر و لە هی وەک خۆی و لە لەخۆخوارتریشەوە فەرموودە نەگێڕێتەوە"، وە لە بوخاری خۆیشییەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: "فەرموودەوان کامڵ نابێت تا لە لەخۆی بانتر و لە هی وەک خۆی و لە لەخۆی خوارتریشەوە فەرموودە نەنووسێت..".

## ۞ ستایشی زانایان لەسەر گێڕەوەکانی سەحیحی بوخاری و ڕەخنەی چەند حافیزێک لە هەندێکیان و وەڵامدانەوەیان

❁ پێشتر باسمانکرد کە ئیمامی شەوکانی لە بارەی دروستیی فەرموودەی (من عادى لي وليا) فەرموویەتی: "هەموو گێڕەوەکانی لە پردی وردبوونەوە تێپەڕیون و قسە و قسەلۆکیان لەسەر نەماوە، وایان لێهاتووە کە گەورەترن

لەوەی قسەیان لەمەڕ بکرێت، یاخود توانج یان سووکایەتیی هیچ کەسێک بیانڕووشێنێت".

❀ حافیز ئیبن حەجەریش لە (مقدمة الفتح) دا فەرموویەتی: "شێخ ئەبولحەسەنی مەقدیسی کاتێک فەرموودەی لە یەکێک لە گێڕەوکانی سەحیحدا دەگێڕایەوە؛ دەیفەرموو: ئەمە لە پردەکە تێپەڕیوە، مەبەستی ئەوە بوو کە گوێ نادرێتە ئەو قسانەی کە لە بارەیەوە گوتراوە".

❀ هەر حافیز ئیبن حەجەر لە شەرحی (نخبة الفكر) دا فەرموویەتی: "گێڕەوەکانی هەردووکیان ( واتە سەحیحی بوخاری و سەحیحی موسلیم) یەکدەنگی دامەزراوە لەسەر بەڕاستاڵزانین (تعديل) یان بە شێوەی (لزوم) داخوازی، ئاخر ئەوان لەپێشترن لە غەیری خۆیان لە گێڕانەوەیاندا، ئەمەش بنەمایەکە و بە بێ بەڵگە لێلادانی نییە".

❁ وە جاران نەریتی زانایان وابوو کە هەندێک جار لە ناساندنی گێڕەوەیەکدا؛ بە بەسیان دەزانی کە بڵێن: لە پیاوانی سەحیحەین یان یەکێکیانە.

❁ ئەمە و هەندێک لە حافیزەکان ڕەخنەیان لە نزیکەی هەشتا پیاوی سەحیحی بوخاری گرتووە، وەک پێشتر لە باسی ڕووەکانی پەسەندیتنی سەحیحی بوخاری بەسەر سەحیحی موسلیمدا باسمانکرد. وە حافیز ئیبن حەجەر لە (مقدمة الفتح) دا لە بەشێکی تایبەتدا یەکبەیەکیانی ناوبردووە و وەڵامی هەموو ئەو ڕەخنانەی داوەتەوە کە لێیان گیراوە، وە لە ژمارە نۆی ئەو دە بەشەی کە لە پێشەکییەکەدا هاتووە فەرموویەتی: "نۆیەم: باسی هۆنینەوەی ناوی هەموو ئەوانەی کە پلاریان تێگیراوە لە پیاوەکانی سەحیحی بوخاری، بە پێی ڕیزبەندیی پیتەکان و وەڵامدانەوەی ئەو توانج و پلارانە بە ڕێبازی ئینساف و دادپەروەری و بیانوودان بە دانەر لە گێڕانەوەی فەرموودە لە هەندێکیانەوە کە لایەنی

پلاری تێدا بەهێزترە، بەوەی کە خۆی پاراستبێت لەوەی کە بەهۆیەوە پلاری تێگیراوە، یان شتێکی لێوە گێڕاوەتەوە کە یەکێکی دیکەی لەو بەهێزتریش کۆک بێت لەگەڵیدا، یاخود هەر هۆیەکی دیکە"، وە لە دەستپێکی ئەو بەشەدا دەڵێت: "پێش قسەکردن لەم بارەیەوە، پێویستە بۆ هەموو بەئینسافێک بزانێت، کە گێڕانەوەی فەرموودە لە لایەن دانەری (الصحيح) ەوە لە هەر گێڕەوەیەکەوە؛ دادپەروەری (عدالة) و دروستیی زەوت (صحة ضبط) و دووری لە بێئاگایی (غفلة) ئەو گێڕەوەیە دەگەیەنێت لای ئەو، نەخوازەڵا ئەوەشی بێتەسەر کە جمهوری پێشەوایان ناوی (الصحيح) یان دابڕیوە بەسەر هەردوو کتێبەکەدا، ئەمەش واتایەکە بۆ جگە لە گێڕەوەکانی (الصحيح) وەدەست نایەت، جا ئەمە وەکوو دابڕینی سیفەتی دادپەروەرییە لە لایەن جمهورەوە، بەسەر ئەوانەی کە لە هەردوو سەحیحدا ناویان هاتووە، ئەمە ئەگەر لە فەرموودە بنەڕەتییەکاندا گێڕانەوەی

هاتبێت، بەڵام ئەگەر لە موتابەعات و شەواهید و تەعالیقدا گێڕانەوەی هاتبێت، ئەوە پلەیان جیاوازە لە زەوت و ئەوانەدا، لەگەڵ وەدەستهاتنی ناوی ڕاسگۆیی بۆیان، جا لێرەدا ئەگەر کەسێکی دیکە پلارێکی هەبێت لە یەکێک لەمانەدا، ئەوە ئەو پلارە دەکەوێتە بەرامبەری تەعدیلی ئەم ئیمامەی کە لێوەی گێڕاوەتەوە و وەرناگیرێت، مەگەر هۆکارەکەی ڕوون و شیکراوە بێت بە پلارێکی ئەوتۆ کە ڕووشێنەری دادپەروەری و زەوتی گێڕەوەکە بێت بە ڕەهایی، یاخود لە گێڕانەوەیەکدا بە تایبەتی، چونکە ئەو هۆکارانەی کە پاڵنەرن بۆ پلارتێگرتن (جرح) جۆراوجۆرن، هەیانە ڕووشێنەرە و هەشیانە ڕووشێنەر نییە".

❄ پاشان ئەو پێنج هۆکارەی ناوهێناون کە خولگەی پلاردانیان لەسەر بەندە، ئەوانیش ئەمانەن: بیدعەت (البدعة)، ناکۆکی (المخالفة)، هەڵە (الغلط)، نەناسراویی حاڵ (جهالة الحال) و گازندەی پچڕان لە سەنەددا (دعوى الإنقطاع

في السند)، وە لەسەر هەر یەکێکیشیان دوواوە لە لای پیاوانی (الصحيح) بە کورتی، پاشان ئاماژەی بە شتانێک داوە کە هەندێک لە زانایان پلاریان پێگرتوون بەڵام ڕووشێنەر نین. وە هەروەک لە (قواعد التحديث)ی قاسمیدا هاتووە، خەتیبی بەغدادی فەرموویەتی: "ئەو خەڵکەی کە بوخاری و موسلیم لێیان وەرگرتوون و لە لایەن غەیری ئەوانەوە پلاریان تێگیراوە، ئەوە لەو سۆنگەیەوەیە کە نەسەلمێنراوە پلارێکی کاریگەری شیکراوەهۆکار (جرح مفسر السبب) بێت...".

❅ حافیزی زەهەبی لە بەشێکدا کە دەربارەی ئەو جێباوەڕ (ثقة) انەی کە قسەی نەڕووشێنەریان لەسەر کراوە کۆیکردووەتەوە؛ دەفەرموێت: "لە دانراوەکەم (الميزان) دا ژمارەیەکی زۆر لەو جێباوەڕانەم نووسیون کە بوخاری و موسلیم و غەیری ئەوانیش لێیان وەرگرتوون، لەبەر ئەوەی ئەو پیاوانە لە دانراوەکانی (جرح) دا ناویان نووسراوە، ئەمەش نەک لەبەر ئەوەی کە لای منیش لاوازییان تێدایە؛

بەڵکوو تا ئەوە بزانرێت، وە بەردەوامیش پیاوی جێباوەڕم بەرچاو دەکەوێت کە قسەیەکی نەڕووشێنەری لەسەرە" هتد.

## ۞ ڕەخنەی هەندێک لە فەرموودەناسە حافیزەکان لە هەندێک فەرموودەی سەحیحی بوخاری و وەڵامدانەوەیان:

❁ حافیز ئیبن حەجەر لە (مقدمة الفتح) دا ئەوەی باسکردووە، کە دارەقوتنی و غەیری ئەویش لە حافیزەکان، ڕەخنەیان لە دووسەد و دە فەرموودەی هەردووسەحیح گرتووە، کە سیودوو دانەیان هەردووکیان هاوبەشن لە گێڕانەوەیاندا، وە حەفتا و هەشتی دیکەیان بوخاری بە تەنها و سەد دانەکەی دیکەش موسلیم بە تەنها گێڕاویانەتەوە، وە - حافیز ئیبن حەجەر - بەشێکی تایبەتی تەرخان کردووە بۆ قسەکردن لەسەر فەرموودە ڕەخنەلێگیراوەکانی سەحیحی بوخاری، فەرموودەکانی بە پێی ڕیزبەندیی سەحیحی بوخاری هێناوە و وەڵامی ڕەخنەکانی بە درێژی داوەتەوە، وە لە

سەرەتای بەشەکەدا بە کورتی وەڵامی داونەتەوە و گوتوویەتی: "بە کورتی وەڵام دەدەینەوە و دەڵێین: "گومان نییە لە پێشخستنی بوخاری و پاشان موسلیم بەسەر خەڵکانی هاوچەرخیان و چەرخەکانی دوای خۆیشیاندا لە پێشەوایانی ئەم زانستە لە زانینی دروست و نادروستدا"، پاشان هەندێک بەڵگەی هێناوە بۆ پاڵپشتی ئەم قسەیەی، ئەوجا گوتوویەتی: "جا کە ئەوە زانراو و جێگیر بوو، کە ئەوان - بوخاری و موسلیم - فەرموودەیەک ناگێڕنەوە جگە لەوەی کە بێدەرد بێت، یان ئەگەر دەرد (علة) یشی هەبێت ئەو دەردە کاریگەر نییە لای ئەوان، جا کە بکرێت قسەی ڕەخنەگرەکان - بە شێوەیەکی دروست - ئاراستە بکرێت؛ ئەوسا دەمێنێتەوە قسەکەی ڕەخنەگر بە تەنها لە بەرامبەر بڕیاری بەدروستزانینی بوخاری و موسلیمدا، گومانیش لەوەدا نییە کە قسەی ئەوان لە قسەی خەڵکی دیکە لەپێشترە لەم بارەیەوە، بە کورتی بەم شێوەیە ڕەخنەکە بەلادادێت.

❁ بەڵام بە درێژی؛ ئەوە ئەو فەرموودانەی بوخاری و موسلیم کە ڕەخنەیان لێگیراوە دەبن بە چەند بەشێکەوە:

یەکەم: ئەوەی کە گێڕەوکان جیاوازییان هەبێت تێیدا، بە زیادی و کەمی لە پیاوانی سەنەدەکەدا.

دووەم: ئەوەی کە گێڕەوەکان جیاوازییان هەبێت تێیدا، بە گۆڕینی پیاوانی بەشێک لە سەنەدەکە.

سێیەم: ئەوەی کە یەکێک لە گێڕەوەکان بە تەنها زیادەیەک بگێڕێتەوە لەو فەرموودەیەدا، کە کەسانێکی ژمارە زۆرتر یان زەوت باشتر هەمان فەرموودەیان گێڕابێتەوە، بەڵام بە بێ ئەو زیادەیە.

چوارەم: ئەوەی کە ئەو فەرموودەیە تەنها کەسێکی لاواز گێڕابێتییەوە.

پێنجەم: ئەوەی کە هەندێک لە پیاوەکانی سەنەدی ئەو فەرموودەیە مەحکووم بێت بە وەهم.

شەشەم: ئەوەی کە جیاوازیی تێدابێت، بە گۆڕینی هەندێک لە واژەکانی دەقی فەرموودەکە.

❁ وە لە کاتی باسکردنی ئەم بەشانەدا، وەڵامیشی بە کورتی داوەتەوە، وە ئاماژەی بۆ هەندێک لەو فەرموودە ڕەخنەبارانەش کردووە، کە بە درێژی قسەی لەسەر کردوون، بە جۆرێک کە وەڵامە کورتەکە ڕوون دەکاتەوە. پاشان گوتوویەتی: "ئەمە کۆی ئەو بەشانەیە کە ئیمامەکان ڕەخنەیان لێوە گرتووەتە سەحیحی بوخاری، وە بە لێکۆڵینەوە و دابەشکردنەوە بە دووروودرێژی خستوومەتەڕوو، وە سوپاس بۆ خودا ئەوەی لێدەرناکەوێ کە کار بکاتە سەر ئەسڵی بابەتی کتێبەکە، مەگەر بە دەگمەن". وە لە کۆتایی بەشەکەدا دەڵێت: "ئەمە تێکڕای ئەو ڕەخنانەیە کە لە سەحیحی بوخاری گیراوە لە لایەن حافیزە ڕەخنەگرە شارەزاکانی بواری دەردی سەنەدەکان (علل الأسانيد)، ئەوانەی کە ئاگاداری نهێنییەکانی ڕێچکەکانن".

❉ تا ئەوەی کە دەڵێت: "جا ئەگەر مرۆڤی بەئینساف تێڕامێنێت لەوەی کە لەو بارەیەوە نووسومە؛ ئەوە بایەخی ئەو کتێبە (سەحیحی بوخاری) لە ناخیدا مەزن دەبێت و لە بەرچاوانی هێژا دەبێت، وە حەق دەدات بە ئیمامەکانی ئەهلی عیلم لە وەرگرتنی ئەم کتێبە بە بێ چەندوچوون، وە لە پێشخستنی بەسەر هەموو دانراوێکدا لە کۆن و نوێدا".

## ۞ گرنگیدانی زانایان بە سەحیح بوخاری:

❉ پوختەی قسان لەم بارەیەوە ئەوەیە کە سەحیحی بوخاری یەکەم دانراوە کە تەنها فەرموودەی دروستی پەتیی لەخۆگرتبێت، وە دروستترین پەڕتووکە لە پاش پەڕتووکە بەپێزەکەی خودای گەورە، وە پیاوەکانی لە پلەوپایەدا لەپێشترن لە غەیری ئەوان.

❁ وە سەرەڕای زۆریی فەرموودەکانی؛ زانا بلیمەتە دیارەکانی ئەم هونەرە ڕەخنەیان لە ژمارەیەکی کەمی نەبێت نەگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنەکان ساغ نەبوونەتەوە.

❁ لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دانەرەکەی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) گێڕانەوە و لێکدانەوە (الرواية والدراية) تێدا پێکەوە کۆکردووەتەوە.

❁ وە ئەم سیفەتە تایبەتانەی ئەو نهێنییە ڕۆشن دەکاتەوە کە چۆن زانایان ئەوەندە پێوەی خەریک بوون و گرنگیی تەواویان پێداوە، هەر لە کۆنەوە هەتاکوو ئێستاش زانایان هەوڵی گەورەیان داوە لە پێناویدا و کاتی بەنرخی زۆریان لە خزمەتیدا خەرجکردووە، وە ئەوەی کە شایستەی بووە ئەوان بۆیان ئەنجامداوە، چەندین زانا شەرحی کردووە، هەیە تێکڕای بە فراوانی شەرحکردووە، هەیە بە کورتی، وە هەیە هەندێک لایەنی ڕوونکردووەتەوە، کتێبی زۆریان لەمەڕ پیاوەکانی نووسیوە، بەتایبەت لەمەڕ شێخەکانی بوخاری

خۆی، وە لەمەڕ سەردێڕی بابەکانی و گونجاویی نێوانیان و بابەتی دیکەش دانراوی تایبەت دانراوە.

❁ وە لەسەرووی هەڵکەوتووەکانی ئەم مەیدانەوە، حافیزی گەورە ئەحمەدی ئیبن حەجەری عەسقەلانی (کۆچکردووی ٨٥٢ ک) ڕادەوەستێ، کە لە کتێبەکە مەزنەکەیدا (فتح الباري) لەگەڵ پێشەکییەکەیدا شتی سەرسوڕهێنەری هێناوە، وەک چۆن دانەرەکەی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) بە بەوپەڕی چاکی بژاریکردووە و کۆیکردووەتەوە؛ هەر بەو چەشنەش حافیز ئیبن حەجەر بەوپەڕی چاکی خزمەتی کردووە و گرنگیی پێداوە، وە ئاستی ئیبن حەجەر لەگەڵ زانایانی دیکەدا؛ وەکوو ئاستی سەحیحی بوخاری وایە لەگەڵ دانراوەکانی دیکەدا، سا خودا ڕەحم بە هەموویان بکات بە ڕەحمەتی فراوانی خۆی وە باشترین پاداشتیان بداتەوە.



سوپاس بۆ خودای گەورە بەم شێوەیە وەرگێڕانی پەڕتووكی

(ئیمامی بوخاری و سەحیحەكەی)

تەواو بوو

وصل اللهم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين